صلى الله عليه وسلم

زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

هەشتەم

# سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص

( رضی الله عنه )

ئامادەکردنی: باوکی یەحیا



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نصْرُ الْمُؤْمِنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

زۆرجار ئێمەی موسڵمان بەشێکی ژیانمان تەرخان دەکەین بۆ خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی، جاری وا هەیە لە بەشێکی ژیاننامەکەدا بەسەرهاتێك کارمان تێدەکات و هەوڵ دەدەین لە ژیانماندا بیکەینە چرایەك بۆ ڕووناککردنەوەی بەرپێمان، چونکە مرۆڤ زووتر لەگەڵ ڕووداوە واقعیەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا زیاتر کاریگەر دەبێت،

ئەم زنجیرەیە بەم مەبەستە نووسراوە، چۆن هاوەڵان بناسین و دیوەجوان و ڕازاوەکانی ناو ژیانی هاوەڵان شارەزابین و بتوانین پەند و وانەیان لێ وەربگرین و لە واقیعی ژیانماندا جێبەجێ بکەین.

ئەم شێوازی فێربوون و فێرکردنە لە قورئانەوە فێر دەبین، کاتێك خوای گەورە پاش گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەران، دەفەرموویێت: (لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ)يوسف. (سوێند بەخوا لەداستان و سەرگوزەشتەی یوسف و براکانیدا، گەلێ عیبرەت و ئامۆژگاریی مەزن هەیە، بۆ خەڵکانی هۆشمەندو ژیر کە بیکەنە ڕێ نیشاندەری خۆیان، بۆ دۆزینەوەی هەق و ڕاستی، دیارە کتێبێکی وەکو ئەم قورئانەش، هەرگیز ناشێ قسەوباسێکی هەڵبەستراو بێت، بەڵکو تەصدیق وپشتڕاستکردنەوەیە بۆ کتێبە پێشووەکانی بەرلەخۆی و شیکەرەوەی هەموو شتێکیشە، بەتەواوی بەیانی حەڵاڵ و حەرامی تێدایە و ڕێ نیشاندان و ڕەحمەت و میهرەبانی خوایە بۆ خەڵکێ بیەوێ باوەڕ بهێنێت).

بەویستی الله تعالى درێژە بەم زنجیرەیە دەدەین و هەولدەدین ژیانی زۆربەی هاوەڵان بلاو بکەینەوە بە چەند مەبەستێك:

یەکەم: بزانین کەسانێك توانییان خوا لە خۆیان ڕازیی بکەن، چۆن ژیان و چۆن توانییان ئەو ڕەزامەندییە بەدەست بهێنن.

دووەم: تێبگەین ئەزموونی پەیڕەوی پەیامی خوا ناواقیعی نیە و تەنها لە پێغەمبەری خوادا ﷺ سنووردار نەبووە، بەڵکو ئەم دینە واقیعیە و دەکرێت مرۆڤەکان پەیڕەوی بکەن، نموونەی یەکەمیشی لە هاوەڵاندا خۆی دەبینێتەوە.

سێیەم: کۆی ئەم دینەی ئێستا ئێمەی موسڵمان پێوەی پابەندین، لەلایەن هاوەڵانەوە بەدەستمان گەیشتووە، گرنگە شتێك لەبارەی ژیان و بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتیانەوە شارەزا ببین، بزانین ئایا ئەم پەیامەمان لە کەسانی سەرڕاست و ژیرەوە وەرگرتووە؟ یان تەمەنێکە لەخشتەبراوین و بە ناحەق پابەندی ئایینێك کراوین کە کەسانێك بە ویستی خۆیان دایانڕشتووەو سەپاندوویانە.

لەم نووسینەدا، تەنها چەند نموونەیەکمان وەرگرتووە، خوێنەری ئازیز دەتوانێت لەم نموونانەوە بەرچاوڕوونییەکی زیاتری هەبێت و خۆی بەدوای دەیان ناونیشان و سەرەباسی تردا بگەڕێت بۆ ژیانی ڕۆژانەی خۆی سوودیان لێ وەربگرێت.

ئەم نووسینە لەلایەکەوە هەوڵێکە بۆ دانەوەی مشتێك لە کۆگایەکی قەرزاریمان لە ئاست هاوەڵان، هیوایەکیشە بۆ پێشەنگیکردن بە کەسانێکەوە کە بە دەقی قورئان خوای گەورە ڕازیبوونی خۆی بۆیان نیشان داوە، ئاواتێکە بۆ سەرهەڵدانەوەی نەوەیەکی نوێی موسڵمان کە بتوانن جارێکی دی پەیامی خوای پەروەردگار لە دڵ و واقیع و خاکی سەرزەویدا پیادە بکەن.

## سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(رضي الله عنه)

ناوی سەعدی کوڕی مالیکەو باوکی بە ئەبی وەقاص ناسراوە، سەعد کونیەکەی ئەبووئیسحاقە، دایکی ناوی حەمنەی کچی سوفیانە. سەعد برایەکی هەبوو بە ناوی عومەیر کە هاوەڵی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ برا بچووکی سەعد بوو، چونکە عومەیر ویستی لە غەزای بەدردا بەشداری بکات بەڵام پێغەمبەر ﷺ لەبەر کەمی تەمەنی عومەیری گەڕاندەوە.

برایەکی تری هەبوو بە ناوی عوتبە کە هاوەڵی پێغەمبەر بوو ﷺ و پێش سەعد و لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ وەفاتی کرد.

ئەم هاوەڵە لە کۆچەریەکانەو زۆر زوو موسڵمان بوو، موسڵمانبوونەکەی لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا بوو.

## منداڵ و هاوسەرەکانی

سەعد سەعد کوڕێکی هەبوو بە ناوی موحەممەد کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، کوڕێکی تری ناوی عامیرە کە ئەویش فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، کوڕێکی تری ناوی موصعەبە کە ئەویش فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، دایکی موصعەب ناوی خەولەی کچی عەمر بوو.

کوڕێکی تری ناوی ئیسحاق بوو کە کونیەکەی بەناوی ئەم کوڕەیەوە بوو، کچێکیشی ناوی ئوممولحەکەم بوو، دایکی ئەم دوو منداڵەی کچی شەهاب بوو، کوڕێکی تری ناوی عومەر بوو کە دواتر بەدەستی موختاری ثەقەفی کوژرا، ئیسحاقی بچووکیشی هەبوو، هەریەك لە ئیسماعیل و ئومموعیمرانیشی هەبوو کە دایکیان ناوی ئوممو‌عامیری کچی عەمر بوو، ئیبراهیم و مووسا و ئوممولحەکەمی بچووك و ئوممو‌عەمر و هیندو ئوممو‌زوبەیر و ئوممو‌مووسایشی لە ژنێکی تری بوون بە ناوی زەبەد، عەبدوڵای بچووك و عەبدوڕەحمان و حەمیدەشی هەبوو کە دایکیان ناوی ئوممو‌هیلالی کچی ڕەبیع بوو، حەمنەشی

هەبوو کە دایکی ناوی ئوممومحەکیم بوو، عومەیری بچووك و عومەر و عیمران و ئوممووعەمر و ئوممومئەییووب و ئوممومئیسحاقیشی هەبوو کە دایکیان ناوی سەلای کچی خەصفە بوو، کوڕێکی تریشی ناوی صالح بوو کە دایکی ناوی طیبەی کچی عامیر بوو، هەریەك لە رەملەو عوثمانیشی هەبوو کە دایکیان ناویان ئوممومحوجەیر بوو، عومرەی هەبوو کە دواتر شووی کرد بە سوهەیلی کوڕی عەبدوڕەحمان و دایکی کەنیزەك بوو، کچێکی تری ناوی عائیشە بوو.

## موسڵمانبوونی سەعد

دەوترێت سەعد سێیەم کەس بووە موسڵمان بووە، چونکە خۆی دەڵێت حەوت دانە شەوم بەسەر برد، لەو ماوەدا من سێ یەکی ئیسلام بووم. بەڵام رای تر هەیە دەڵێت چوارەم یان شەشەم کەس بووە موسڵمان بووە، ئەم رایەش نزیکترە لە راستیەوە، چونکە بە روونی سەلماوە کە پێش ئەو چەند کەسی تر موسڵمان بون، لەوانە خەدیجە و ئەبووبەکر و زەید.

سەعد دەڵێت سێ رۆژ پێش موسڵمان بوونم خەوم بینی لە تاریکیەکدام و هیچ نابینم، مانگێك رووناکی بۆ کردم، منیش شوێنی کەوتم و تەماشام دەکرد بزانم کێ پێش من ئەو مانگەی دیوە، تەماشام کرد زەیدی کوڕی حارثەو عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و ئەبووبەکر لەوێن، پرسیارم کرد کەی گەیشتوونەتە ئەوێ؟ وتیان ئێستا، دواتر بیستم پێغەمبەر ﷺ بە نهێنی بانگەواز دەکات، چووم لە شیوێك بینیم نوێژی عەسری دەکرد، لەوێ گوێم لێگرت و باوەڕم پێهێنا.

سەعد لەسەر دەستی ئەبووبەکری صدیق بانگەوازی ئیسلامی وەرگرت، کاتێك ئەبووبەکر موسڵمان بوو، چوو بۆ لای عوثمانی کوڕی عەففان و طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و زوبەیری کوڕی عەووام و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و باسی ئیسلامی کرد بۆیان و بانگهێشتی کردن بۆ ئیسلام، هەموو ئەوانەش موسڵمان بوون.

خۆڕاگری سەعد لەسەر باوەڕەکەی سەعد دەڵێت من پێشتر زۆر لەگەڵ دایکم چاك بووم، جا کاتێك موسڵمان بووم دایکم وتی ئەی سەعد ئەم دینە چیە هێناوتە؟ یان واز لەو دینە دێنیت یان من خواردن و خواردنەوە لە خۆم حەرام دەکەم تا دەمرم و بەو هۆیەوە لەبەر من ئابڕووت دەچێت و دەڵێن بکوژی دایکتی، منیش وتم دایە گیان ئەوە مەکە، من واز لە دینەکەم ناهێنم، ئەوەبوو رۆژێك دەستی گرتەوە لە خواردن و خواردنەوە، بۆ بەیانیەکەی زۆری بۆ هاتبوو، منیش کە ئەوەم بینی وتم دایە گیان بەخوا ئەگەر سەد گیانت هەبێت و یەك یەك هەموویان دەربچن واز لە دینەکەم ناهێنم، جا ئەگەر پێت خۆشە بخۆ

و پێشت خۆشە مەخۆ، دایکم کە زانی وا سوورم دەستی کرد بە نان خواردن.

جارێك سەعد لەگەڵ دەستەیەك لە هاوەڵان لە شیوێکی مەککەدا نوێژیان دەکرد، دەستەیەك لە بێباوەڕانی قورەیش هاتن بۆ لایان و گاڵتەیان پێدەکردن، بار گەیشتە ئەوەی کەوتنە لێدانی موسڵمانان، سەعد هەستا و دای لە یەکێکیان و جەستەی خوێناوی کرد.

کۆچکردنی سەعد سەعد هاودەم بە عومەیری برای کۆچیان کرد بۆ مەدینە، لەوێ لای عوتبەی برایان مانەوە کە پێشتر بەهۆی خوێنێکەوە کە رشتبووی چووبوویە مەدینە.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، برایەتی خستە نێوان سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و سەعدی کوڕی موعاذەوە.

هێشتا نۆ مانگ بوو پێغەمبەر ﷺ کۆچی کردبوو بۆ مەدینە کە سەعدی کرد بە ئەمیری سریەیەك و ئالایەکی سپی دایە دەستی و هاودەم بە بیست کەس لە کۆچەران ناردی تا رێ بگرن بە کاروانێکی قورەیشیەکان، سەعد دەڵێت دەرچووین و بە رۆژ خۆمان دەشاردەوەو بە شەو رێمان دەکرد تا پاش پێنج رۆژ گەیشتینە شوێنی مەبەست، بینیمان ئێوارە کاروانەکە دەرچووبوون، دواتر گەڕاینەوە بۆ مەدینە.

## جیهادو بەشداری غەزاکان

سەعد یەکەم کەس بوو لە رێی خوای گەورە تیری هاویشت.

کاتێك پێغەمبەرﷺ ویستی بچێت بۆ غەزای بەدر و لە نزیك بەدر دابەزی، سەعد و عەلی و زوبەیری نارد تا هەواڵی قورەیش وەربگرن. سەعد لە غەزای بەدردا بەشداری کرد، لەو کاتەدا تەمەنی زۆر نەبوو، سەعد خۆی دەڵێت هێشتا تاڵە موویەك بە دەموچاومەوە نەبوو کە بەشداری غەزای بەدرم کرد.

سەعد دەڵێت پێش ئەوەی بچین بۆ بەدر، عومەیری برامم بینی خۆی دەشاردەوە، وتم براکەم ئەوە چیتە؟ وتی ترسی ئەوەم هەیە پێغەمبەر ﷺ بمبینێت و بە بچووکم بزانێت و نەهێڵێت بەشداری غەزاکە بکەم، حەزیش دەکەم بێم و بەشدار بم بەڵکو خوای گەورە شەهیدیم پێ ببەخشێ، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ ئەوی بە بچوك زانی و گێڕایەوە، عومەیر دەستی کرد بە گریان، دواتر پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی پێدا، منیش بینیم هێندە بچووکە خۆم بەرگە سەربازیەکەیم بۆ ڕێکدەکرد، لە غەزاکەدا کوژرا و تەمەنی هێشتا شانزە ساڵان بوو.

ئیبن مەسعوود دەڵێت لە بەدردا من و سەعد و عەمار لە دەستکەوتدا هاوبەش بووین، سەعد خۆی تەنها دوو دیلی پێ بوو، بەڵام ئێمە هیچ دیلێکمان پێ نەبوو.

دواتریش لە سریەکەی عەبدوڵای کوڕی جەحشدا بەشداری کرد و هاودەم بە عوتبەی کوڕی غەزوان لەسەر یەك وشتر بوون.

سەعد لە غەزای بواطدا هاودەم بە پێغەمبەر ﷺ بەشداری کرد و ئالایەکی سپی بەدەستەوە بوو.

سەعد یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای ئوحود، سەعد دەڵێت لەو غەزایەدا دوو کەسم بینی لە دەوری پێغەمبەر ﷺ بوون و دەجەنگان و بەرگرییان لێدەکرد، جلی سپییان لەبەر بوو، نەپێشتر ئەو دوو کەسەم دیبوون و نە دواتر بینینمەوە.

سەعد دەڵێت لە ڕۆژی ئوحوددا عەبدوڵای کوڕی جەحش پێی وتم وەرە با لە خوای تعالی بپاڕێینەوە، ئەوەبوو چووینە سووچێکەوە، من نزام کرد وتم خوایە سبەی بگەم بە کابرایەکی زۆر بەهێز و لەپێناو تۆدا لەگەڵی بجەنگم و دواتر بەسەریدا سەربکەوم تا بیکوژم و شمەکەکەی بەدەستکەوت بەرم، عەبدوڵای کوڕی جەحشیش وتی خوایە سبەینێ تووشم بێت بە تووشی کابرایەکی زۆر بەهێزەوەو لەپێناو تۆدا لەگەڵی بجەنگم، دواتر بمکوژێت و گوێ و لووتم ببڕێت، کە ڕۆژی دوایی گەیشتمەوە بە تۆ بفەرموویت ئەی عەبدوڵا بۆچی گوێ و لووتت براوە؟ منیش بڵێم لەپێناو تۆ پاشان پێغەمبەرەکەتدا، تۆیش بفەرموویت ڕاست دەکەیت، سەعد دەڵێت: نزاکەی عەبدوڵا

لەوەی من باشتر بوو، کۆتای رۆژی ئوحود تەرمەکەیم بینی گوێ و لووتی کرابوون بە دەزوویەکەوە.

سەعد دەڵێت هێندەی سوور بوم لەسەر کوشتنی عوتبەی کوڕی ئەبی وەققاص، هیچ کات هێندە سوور نەبوم لەسەر کوشتنی هیچ کەسێك، چونکە عوتبە خوێنی هێنابوو بە دەموچاوی پێغەمبەردا ﷺ سەعد دەڵێت لە غەزای ئوحوددا کە خەڵکی لە دەوری پێغەمبەر ﷺ تەکینەوە، منیش کەنارم گرت و وتم خۆم دەدەمە بەر ئەو لێشاوە، یان شەهید دەبم یان رزگار دەبم تا دەگەم بە پێغەمبەر ﷺ، لەو بارەدا بووم کە کەسێکی دەموچاو هەڵبەستراوم بینی نەمدەزانی کێیە، بێباوەڕان هاتن، وتم ئێستا پێی دەگەن، کەچی ئەو دەستی پڕ کرد لە وردەچەو و وەشاندی بەروویاندا و هەموو گەڕانەوە، چەند جار ئەوەی کرد، تەنها میقدادی کوڕی ئەسوەد لەنێوان من و ئەودا هەبوو، ویستم بڵێم میقداد ئەوە کێیە، میقداد وتی ئەی سەعد ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ بانگت دەکات، وتم لە کوێیە؟ میقدادیش بە ئاماژە پێی نیشان دام، منیش چووم بۆ لای، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەی سەعد ئەمڕۆ لە کوێ

بوویت؟ وتم لە کوێوە پێغەمبەری خوام ﷺ دیبێت لەوێوە بوم، پێغەمبەر ﷺ لەپێش خۆیەوە داینیشاندم و تیرم دەهاویشت و دەموت خوایە ئەمە تیری خۆتە، بیدە لە دوژمنی خۆت و دوژمنی پێغەمبەرەکەت، پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو (خوایە نزاکەی سەعد گیرا بکە، خوایە هاویشتنەکەی بپێکێت، ئادەی سەعد، بەدایك و باوکمەوە بەقوربانت بم)، ئیتر چی تیرێکم دەهاویشت پێغەمبەر ﷺ نزای بۆ دەکردم، تا هەموو تیرەکانم تەواو بوون، ئینجا پێغەمبەر ﷺ تیرەکانی خۆی دەدایە دەستم.

سەعد دەڵێت لە غەزای ئوحوددا پێغەمبەر ﷺ کیفی تیرەکانی خۆی پێدەدادم و دەیفەرموو (بوەشێنە بە دایك و باوکمەوە بەقوربانت بم).

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە کە سەعد لە غەزای ئوحوددا نزیکەی هەزار تیری هاویشتووە، ئەگەرچی ڕێژەکە عەقڵ نایبڕێت، چونکە ئەگەر تیرەکانی خۆی و پێغەمبەر ﷺ و چەند کەسێکی تریشی هاویشتبێت ناکاتە پێنج سەد تیریش، بەڵام ئاماژەیە بەوەی تیری زۆری هاویشتووە.

هەروەها سەعد لە غەزای خەندەقیشدا بەشداری کرد، لەو غەزایەدا تیری دەهاویشت، پێغەمبەر ﷺ بە جووڵەی سەربازیی سەعد پێکەنی تا ئەوەی دانەکانی پێشەوەی دەرکەوتن.

سەعد لە ڕێککەوتنی حودەیبیەشدا بەشدار بوو، هەروەها یەکێك بوو لە شایەتەکانی ڕێککەوتنەکە.

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص لە فەتحی مەککەشدا بەشداری کرد و تیایدا ئالایەکی کۆچەرانی بەدەستەوە بوو.

لە غەزای حونەیندا بەشدار بوو، لەو غەزایەدا ئالآیەکی بەدەستەوە بوو.

دواتر کە پێغەمبەر ﷺ سوپایەکی ئامادە کرد بۆ هێرشی دژ بە ڕۆم، ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد بە سەرکردەی سوپاکە، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص یەکێك بوو لە بەشداربوانی ناو ئەو سوپایە.

سەعد موژدەی بەهەشتی پێدراوە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە سەعد یەكێكە لەو دە هاوەڵەی پێغەمبەر ﷺ موژدەی بەهەشتی پێدان.

موژدەكانی پێغەمبەر ﷺ بۆ چوونە بەهەشتی سەعد چەند جار دووبارە بووەتەوە، ئەوەتا جارێك موغیرە لای سەعیدی كوڕی زەید قسەی بەرامبەر بە عەلی كوڕی ئەبووطالیب كرد، سەعید هەستاو وتی من شایەتی دەدەم بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو (عشرة في الجنة: النبي في الجنة، وأبو بكر في الجنة، وعمر في الجنة، وعثمان في الجنة، وعلي في الجنة، وطلحة بن عبيد الله في الجنة، والزبير بن العوام في الجنة، وسعد بن مالك في الجنة، وعبد الرحمن بن عوف في الجنة)، (دە كەس لە بەهەشتدان: پێغەمبەر ﷺ لە بەهەشتدایە، ئەبووبەكر لە بەهەشتدایە، عومەر لە بەهەشتدایە، عوثمان لە بەهەشتدایە، عەلی لە بەهەشتدایە، طەلحەی كوڕی عوبەیدوڵا لە بەهەشتدایە، زوبەیری كوڕی عەووام لە بەهەشتدایە، سەعدی كوڕی مالیك لە بەهەشتدایە، عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف

لە بەهەشتدایە)، ئینجا زەید وتی بمویستایە کەسی دەیەمیشم دەوت، وتیان کێیە؟ بێدەنگ بوو، دواتر زۆریان لێکرد تا بیلێت، ئەویش وتی سەعیدی کوڕی زەید-واتە خۆی-.

عەبدوڵای کوڕی عەمر دەڵێت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (یەکەم کەس لەم دەرگاوە دێتە ژوورەوە پیاوێکە لە ئەهلی بەهەشتە)، ئەوەبوو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هاتەژوورەوە.

سەعد لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دایکی باوەڕداران عائیشە دەڵێت شەوێك پێغەمبەر ﷺ کە هاتبوویە مەدینە ماندوو بوو، فەرمووی (خۆزگە ئەمشەو پیاوچاکێك لە هاوەڵانم پاسەوانی دەکردم)، دەنگی چەکێکمان بیست، پێغەمبەرﷺ فەرمووی (ئەوە کێیە؟) وتی من سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصم هاتوم تا پاسەوانیت بکەم، ئیتر پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ خەوت.

جابیری کوڕی عەبدوڵا دەڵێت جارێك سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص هات و ئێمەش لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە خاڵۆی منە، جا کامتان دەیەوێ با خاڵۆی خۆی بخاتەڕوو)، ئەمەش وەك شانازی کردنێك بە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصەوە.

سەعد دەڵێت جارێك لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووم و دەستەیە هاتنە خزمەتی، پێغەمبەر ﷺ بەخششی هەموویانی کرد تەنها کەسێك نەبێت کە من لە هەموویان زیاتر بەو سەرسام بووم، وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی فلانت بێبەش کرد بەخوا من بە باوەڕدار دەیبینم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (یان –بڵێ- موسڵمان)، منیش بێدەنگ بووم، دوای کەمێکی تر خۆم پێ ڕانەگیرا و هەمان شتم وتەوەو پێغەمبەر ﷺ هەمان شتی فەرموو، منیش بێدەنگ بووم، هەمدی خۆم پێ ڕانەگیرا و هەمان شتم وتەوەو ئەویش هەمان شتی فەرموویەوە، دواتر فەرمووی (ئەی سەعد من بەخششی کەسێك

دەکەم و کەسی تر هەیە لەو خۆشەویستترە لەلام، ئەوەش لە ترسی ئەوەی نەبادا پەروەردگار فڕێی داتە ناو دۆزەخەوە).

سەعد لە کۆتا ساڵی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ نەخۆش کەوت، پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ سەردانی، سەعد دەڵێت وتم من وا نەخۆشی زۆری بۆ هێناوم و سامانم هەیەو تەنها کچێکم هەیە میراتم لێ وەربگرێت، ئایا دوو لە سێی سامانم بکەم بە خێر؟ فەرمووی نا، وتم ئەی نیوەی؟ فەرمووی نا، دواتر فەرمووی: (الثلث والثلث كبير -أو كثير- إنك أن تذر ورثتك أغنياء، خير من أن تذرهم عالة يتكففون الناس، وإنك لن تنفق نفقة تبتغي بها وجه الله إلا أجرت بها، حتى ما تجعل في في امرأتك)، (سێ یەك، سێ یەكیش زۆرە، ئەگەر تۆ بهێڵیت میراتگرەكانت دەوڵەمەند بن بۆت باشترە لەوەی بە هەژاری بیانهێڵیتەوەو چاو لە دەستی خەڵك بن، تۆ هەر خەرجیەك بكەیت لەپێناو خوادا بێت پاداشتی لەسەر وەردەگریت، تەنانەت ئەوەش بۆ ژنەكەت دەیكەیت) منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بهێڵم لە مەككە بمرم و پاداشتی هیجرەتم بۆ نەبێت؟ فەرمووی (تۆ

دواناکەویت-زۆر دەژیت- و کاری چاکە دەکەیت بەوەش پلە بەرزیت پێی زیاد دەکات، پاشان لەوانەیە تۆ زۆر بژیت تا ئەوەی برێ قەوم لێت سوودمەند بن، خوایە کۆچی هاوەڵانم وەرگرەو مەیانگێڕەوە دواوە، بەڵام بێهیوا سەعدی کوڕی خەولەیە) چونکە لە مەککە کۆچی دوایی کرد.

سەعد دەڵێت جارێك لە مەککە نەخۆش کەوتم و پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام، دەستی پیرۆزی خستە سەر تەوێڵم و دەستی هێنا بە دەموچاو و سنگ و سکمدا و فەرمووی (خوایە شیفای سەعد بدەو هیجرەتەکەی بۆ تەواو بکە)، تا ئێستاش هەست بە ساردی جێدەستی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ دەکەم لەسەر جەرگم.

## لە سەردەمی ئەبووبەکری صدیقدا

ئەبووبەکری صدیق دژ بە هەڵگەڕاوەکان جەنگی راگەیاند، بۆ ئەوەش مەترسی لەسەر مەدینە دروست دەبوو، بۆیە پاسەوانی شەوانەی بە دەوری مەدینەدا دانا و بڕێك کەسی کرد بە ئەمیری دەستەی ئەو پاسەوانانە، لەوانەش عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و زوبەیری کوڕی عەووام و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و طهلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و عەبدوڵای کوڕی مەسعوود.

## سەعد لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا

سەعد دەڵێت لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا جارێك لە مزگەوتدا دام بە لای عوثمانی کوڕی عەففاندا، ئەویش بە تەواوی چاوی بڕیبووە من، سەلامم لێکرد کەچی وەڵامی نەدامەوە، منیش چووم بۆ لای عومەر و سکاڵام لا کرد و وتم ئەی ئەمیری باوەڕداران ئایا هیچ گۆڕانکاریەك لە ئیسلامدا روویداوە؟ دوو جار ئەوەم پێ وت، ئەویش وتی نا، بەڵام بۆچی؟ وتم هیچ، تەنها هێندە هەیە

من کەمێك پێش ئێستا لە مزگەوتدا دام بە لای عوثمانداو سەلامم لێکرد، چاوی بڕیبووە من کەچی وەڵامی نەدامەوە، عومەر ناردی بە شوێن عوثماندا و عوثمان هات، عومەر وتی بۆچی سەلامی براکەتت وەڵام نەداوەتەوە؟ عوثمان وتی شتی وام نەکردووە، سەعد وتی با واتکرد، عوثمان سوێندی خوارد شتی وانەبووەو منیش سوێندم خوارد شتی وا بووە، دواتر عوثمان بارەکەی بیر کەوتەوەو وتی بەڵێ وایە، خوایە لێم خۆش بە، تۆ کەمێك پێش ئێستا دات بەلامدا، لەو کاتەدا من لە خەیاڵی فەرموودەیەکدا بووم کە لە پێغەمبەرم ﷺ بیستبوو، سوێند بەخوا هەرکات بیرم دەکەوێتەوە چاو و دڵم بە پەردەیەك دادەپۆشرێت، منیش وتم دەی من فەرموودەکەت بۆ دەگێڕمەوە، پێغەمبەر ﷺ باسی یەکەم نزای بۆ کردین، دەشتەکیەك هات بۆ لای و سەرقاڵی کرد، پێغەمبەر ﷺ هەستا، منیش شوێنی کەوتم و هەوڵم دەدا پێشم نەکەوێت، کەچی پێشم کەوت، کە ویستی بچێتەژوورەوە، بە توندی پێم کوتا بە زەویدا، پێغەمبەر ﷺ لایکردەوە بە لامدا و فەرمووی ئەوە کێیە؟ ئەبوئیسحاقە؟

وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئەی بۆ وا؟ وتم بەخوا تەنها لەبەرئەوەی تۆ باسی یەکەم نزات بۆ کردین، ئەم کابرا هات و سەرقاڵی کردیت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (نعم دعوة ذي النون إذ هو في بطن الحوت: لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين فإنه لم يدع بها مسلم ربه في شيء قط إلا استجاب له)، (بەڵێ، نزاکەی ذیننوون کە لە سکی حووتدا بوو نزای کرد (لاالە الا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين)، هەر موسڵمانێك بەو نزایە لە پەروەردگاری بپاڕێتەوە خوا نزاکەی وەڵام دەداتەوە).

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص سەرکردەی فتووحاتی عێراق بوو، لە جەنگی قادسیەدا پێشڕەوی سوپا بوو و خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو سەرکەوتنی بەخشی بە موسڵمانان، مەدائینیان گرت و لە جەنگی جەلەولائیشدا دووبارە ئەمیری موسڵمانان بوو.

کاتێك پێشەوا عومەر ویستی سەعد بنێرێت بۆ عێراق ئامۆژگاری کرد و پێی وت ئەوە لەخشتەت نەبات بوترێت خاڵۆ و هاوەڵی پێغەمبەری خوایت ﷺ چونکە خوای تعالی خراپە بە خراپە ناسڕێتەوەو خراپە بە چاکە دەسڕێتەوە، نێوانی خواو بەندە تەنها گوێڕایەڵی خوای گەورە هەیە...ئینجا ئامۆژگاری کرد خۆڕاگر بێت، چوار هەزار سەربازی دایە دەستی، لەولاشەوە موثەننا چاوەڕێی هاتنی سەعدی دەکرد و بریندایش بوو، بەڵام پێش گەیشتنی سەعد مرد، بەردەوام لە ڕێگەشدا سوپاکەی سەعد زیادی دەکرد و لەملاولاوە سوپای تر پەیوەستی دەبوون تا ئەوەی نزیکەی سی و ئەوەندە هەزار موجاهید ئامادەی جەنگی قادسیە بوون لەگەڵی، نزیکەی نەوەد و نۆ کەسی بەشداربووی بەدر لەناو سوپاکەی سەعددا بوون.

سەعد هەموو سوپاکەی کۆکردەوەو ئەمیری بۆ بەشەکانی سوپا دانا و ئالای دابەش کرد و لە دانانی کەسەکاندا پابەندی ڕێنماییەکانی خەلیفە بوو، هاوکات ڕێنمایەکانی موثەنای وەرگرت کە پێش مردنی دەریبڕیبوون تا بگەن بە سەعد و سوود لەو ئەزموونە وەربگرێت.

کاتێك سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص لە عێراق سەرقاڵی فتووحات بوو، پێشەوا عومەری کوڕی خەططاب نامەی نارد بۆ ئەبووعوبەیدە لە شام و فەرمانی پێکرد سەربازەکانی بنێرێت بۆ عێراق بۆ پشتیوانی سەعد، ئەویش سەربازەکانی نارد و هاشمی کوڕی عوتبەی کرد بە ئەمیریان.

سەعد چوو بۆ ناوچەی قادسیە، لەوێ بوو کە نامەی خەلیفەی پێگەیشت و موژدەی ئەوەی پێدا پێی وایە ئەگەر هێرش ببەنە سەر دوژمن سەرکەوتوو دەبن، هەروەها ڕێنمایی کرد وریای هەڵەو ناپاکی بێت و نەهێڵێت بەهێزی دوژمن سامیان لەناوبەرێت.

سەرکردەی بەهێزی سەربازی فارسەکان کەسێك بوو بە ناوی ڕۆستەم.

پاش ئەوەی ڕۆستەم سوپایەکی زۆری کۆکردەوەو بەرو رووی سەعد هات و نزیکبوویەوە، داوای گفتگۆی کرد لەگەڵ موسڵمانان‌دا، سەعدیش نێردراوی خۆی نارد و لەو نێوەندەدا وتوێژ زۆر کرا، بەڵام

ئەنجامی نەبوو، ئەوەبوو جەنگ روویدا و جەنگێکی زۆر سەخت بوو، تیایدا موسڵمانان سەرکەوتن.

خوێنەری ئازیز ئەگەر لێرەدا باسی وردەکاری فتووحاتەکانی سەعد و جەنگی قادسیە بکەین، پێویستی بە نووسینێکی زۆر و سەربەخۆ هەیە، بۆیە بە کورتی لێرەدا بڕیومانەتەوە، ئەوەی وردەکاری زیاتری دەوێت لەو بارەوە با کتێبەکانی تایبەت بە فتووحات یان نووسینەکانی تایبەت بە سەردەمی خیلافەتی پێشەوا عومەری کوڕی خەططاب بخوێنێتەوە. هەروەها کاتێك خەڵکی ناوچەی حیرە هەمدی هەڵگەڕانەوەو بێباوەڕ بوون، سەعد ئەو شوێنەی فەتح کردەوە.

دواتر هێرشەکانی بۆ هیت و قرقیسیاو چەند ناوەی تر بەردەوام بون.

ئینجا خەلیفە لە ساڵی نۆزدەی کۆچیدا داوای لێکرد ئەگەر فتووحاتی عێراق و شام تەواو بوو، با بکەوێتە فتووحاتی ناوچەی جزیرە.

سەعد لەلایەن خەلیفە عومەری کوڕی خەططابەوە کرابوو بە والی کووفە، دەوترێت سەعد بناغەدانەری کووفە بووەو کردوویەتی بە شار، بەڵام لە ساڵی بیستی کۆچیدا خەلیفە سەعدی لە والیەتی کووفە لابرد.

جارێك خەڵکێ لە کووفە سکالایان لەسەر سەعد هەبوو و وتیان نازانێت جوان نوێژ بکات سەعدیش وتی من بەوجۆرە نوێژیان بۆ دەکەم کە پێغەمبەر ﷺ دەیکرد، عومەر نێردراوی نارد تا وردەکاری وەربگرێت، لە هەر کوێی کووفە هەواڵیان دەپرسی دانی خێریان بە سەعددا دەنا، تا چوونە مزگەوتێ بەنی عەبس، لەوێ کابرایەك نارەزایی دەربڕی و وتی مادەم سوێندتان دام دەی با بزانن نە دادپەروەرە و نە بە دروستی دەستکەوت و مووچە دابەش دەکات و نە گەڕانی نهێنی هەیە، سەعد کە ئەوەی بیست وتی خوایە ئەگەر درۆ دەکات چاوی کوێر بکەو تەمەنی درێژ بکە تا دەکەوێتە ناو فیتنەوە، ئەوەبوو کابرا تەمەنی کرد و ئەو شتانەی تووش بوو، عەبدولمەلیك دەڵێت کابرام بینی هەواڵیم پرسی، وتی نزاکەی سەعدم لێ گیرا بووە.

پێشەوا عومەر بڕیاری دا وردەکاری دارایی والیەکانی بزانێت، بۆیە نامەی نارد بۆیان تا هەموویان ڕێژەی سامانی خۆیان بنووسن، نامەی نارد بۆ سەعدیش، کە سەعد ڕێژەی سامانەکەی خۆی نووسی، پێشە وا عومەر سامانەکەی کرد بە دوو بەشەوە، بەشێکی بۆ هێشتەوەو نیوەکەی تری خستە بەیتولمالەوە.

بەهۆی سکاڵای خەڵکەوە سەعد لە ساڵی بیست و یەکی کۆچیدا لەلایەن خەلیفە عومەری کوڕی خەططابەوە لە ئەمیرایەتی کووفە لابرا.

بەڵام ئەو لابردنەی سەعد لەلایەن عومەرەوە لەبەر کەمتەرخەمی سەعد نەبوو، وەك پێشەوا عومەر خۆی دەڵێت من سەعدم لەبەر لاوازی یان ناپاکبوونی لانەبردووە، هەر بۆیە دەبینین پێشەوا عومەر پێش شەهیدبوونی شەش کەس کاندید دەکات بۆ خیلافەت، یەکێکیان سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصە.

گیرابوونی نزای سەعد لای هەموان روون بوو، بۆیە هەموان دەترسان لە نزاکانی سەعد، سەعد کەنیزەکێکی هەبوو جلێکی تازەی پۆشیبوو، رەشەبا هات و جلەکانی کەنیزەکەکەی بەزر کردەوەو جەستەی دەرکەوت، عومەری کوڕی خەتتاب کە بینی بە گۆچانەکەی دەستی دای لە کەنیزەکەکە، سەعد هات تا رێ لە عومەر بگرێت کەچی عومەر بە گۆچانەکەی دای لە سەعدیش، سەعد کەوتە نزاکردن لە عومەر، عومەر خێرا گۆچانەکەی دەستی دایە دەست سەعد و وتی تۆڵەی خۆت بکەرەوە، سەعدیش لێی خۆش بوو.

کاتێك پێشەوا عومەر کوڕی خەططاب بریندار کرا و لە دوارۆژەکانی ژیانیدا بوو، ویستی پاش خۆی خەلیفە دابنرێت، بۆیە شەش کەسی دیاری کرد تا یەکێك لە خۆیان هەڵبژێرن بۆ خیلافەت، یەکێك لەو شەش کەسە بریتی بوو لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص.

## سەعد لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا

کە عوثمانی کوڕی عەففان بوو بە خەلیفە، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصی کردەوە بە ئەمیری کووفە، ئەمەش لەسەر وەسیەتی خەلیفەی پێشوو عومەری کوڕی خەططاب بوو کە پێش مەرگی خۆی وەسیەتی کردبوو: وەسیەت دەکەم بۆ خەلیفەی دوای خۆم تا سەعد بکات بەکاربەدەست، چونکە من ئەوم لەبەر خراپەکاری یان ناپاکی لانەبرد، پێشەوا عوثمان پاش ماوەیەکی زۆر سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصی لە والیەتی کووفە لابرد، ئەویش لەبەر کێشەیەك کە لەگەڵ ئیبن مەسعوود هەیبوو، چونکە قەرزی لە بەیتولمال کردبوو و ئیبن مەسعوودیش بەرپرسی بوو، کاتێك ئیبن مەسعوود داوای قەرزەکەی کردەوە لە سەعد، سەعد توانای نەبوو بیداتەوە، بۆیە کێشە کەوتە نێوانیانەوە، هەواڵەکە گەیشتەوە بە پێشەوا عوثمان و ئەویش سەعدی لابرد و وەلیدی کوڕی عوقبەی لە شوێنیدا دانا.

کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان گەمارۆ درابوو، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص چوو بۆ سەردانی.

سەعد هاودەم بە چەند هاوەڵێکی تر داوای لە عوثمان کرد تا بەرگری بکەن و بجەنگن، بەڵام خەلیفە داوای کرد دەستبەردار بن و نەجەنگن.
لە کاتی فیتنەی شەهیدبوونی عوثمانی کوڕی عەففاندا سەعد دەیوت شایەتی دەدەم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: (إنها ستكون فتنة القاعد فيها خير من القائم، والقائم خير من الماشي، والماشي خير من الساعي) (بەم دواییانە فیتنەیەك دێت ئەوەی تیایدا دانیشتووە زۆر باشترە لەوەی بەپێوەیە، ئەوەی بە پێوەیە زۆر باشترە لەوەی دەچێت بەڕێدا، ئەوەی دەچێت بەڕێدا زۆر باشترە لەوەی پەلە ڕێ دەکات).
کاتێك سەعد هەواڵی کوژرانی عوثمانی بیست داوای لێخۆشبوونی لای خوای تعالی بۆ کرد و سۆزی بۆی جوولا و ئەم ئایەتەی خوێندەوە (قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا (١٠٣) الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا) (الكهف: ١٠٣ - ١٠٤)، پاشان سەعد وتی خوایە پەشیمانیان بکەرەوەو ئینجا لەناویان بەرە.

## سەعد لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبوو تالیبدا

کاتێك عوثمانی کوڕی عەففان شەهید کرا، هەوڵ درا کەسێك بکرێت بە خەلیفە، ئەوەبوو چوون بۆ لای سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و وتیان تۆ لە ئەهلی شوورا بویت، بەڵام ئەو رازی نەبوو، ئینجا چوون عەلی کوڕی ئەبووطالیبیان کرد بە خەلیفە.

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص سەرەتا بەیعەتی نەدا بە عەلی و ماوەیەك مایەوە، دواتر چوو بەیعەتی پێدا.

لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا سەعد کەناری گرت لە فیتنەو لە هەردوو جەنگی جەمەل و صفین بەشدار نەبوو و دووریشی گرت لە مەسەلەی تەحکیم.

سەعد لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیاندا جارێك کابرایەك قسەی دەوت بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب، سەعد رێگری لێکرد، کەچی کابرا وازی نەهێنا، سەعد نزای لێکرد، هەر لەو کۆڕەدا وشترێك هات و دای بەسەر کابرادا و هێندە لەقەشێلی کرد تا کابرا مرد.

کاتێك موعاویە دەسەلاتی گرتەدەست، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص چوو بۆ لای و پێی وت سەلامت لێ بێت ئەی پاشا، موعاویە پێکەنی و وتی ئەی ئەبووئیسحاق چی دەبوو بتوتایە ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەویش وتی وا بە پێکەنینەوە دەیڵێیت؟ بەخوا حەزم لەوە نیە لە بری تۆ ئەو پۆستەم وەربگرتایە.

جارێك سەعد چوو بۆ لای موعاویە و سەلامی ئەمیرایەتی لێنەکرد، موعاویە گلەیی لێکرد، سەعد وتی ئێمە تۆمان نەکردووە بە ئەمیر، بەخوا حەز ناکەم لە شوێنی تۆدا بم و قاپە خوێنێکم رشتبێت.

لەو ساڵەی کە ساڵی وەفاتی سەعد بوو، ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەمیش وەفاتی کرد، جا ئەرقەم وەسیەتی کردبوو سەعد بێت نوێژی لەسەر بکات، کە مرد سەعد لە عەقیق بوو کە ماوەیەك لە مەدینەوە دوور بوو، مەروان کە والی مەدینە بوو وتی چۆن دەبێت تەرمی هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ ئاوا بوەستێنرێت، بۆیە ویستی نوێژی لەسەر بکات، بەڵام منداڵەکانی نەیانهێشت تا سەعد هات و نوێژی لەسەر کرد.

سەعد لەساڵی پەنجاو پێنجی کۆچیدا لە کۆشکەکەی خۆی لە ناوچەی عەقیق وەفاتی کرد، ئەو ناوچەیە نزیکەی حەوت میل لە مەدینەوە دووربوو، ئینجا تەرمەکەی برا بۆ مەدینە، سەعد کۆتا هاوەڵی کۆچەران بوو کە وەفاتی کرد. سەعد لە کاتی وەفاتیدا تەمەنی هەشتاو دوو ساڵ بوو، رایەکی تریش دەڵێت تەمەنی حەفتا و ئەوەندە ساڵ بوو. موصعەبی کوڕی دەڵێت سەری باوکم لە کۆشم بوو کاتێك لەسەرەمەرگدا بوو، منیش دەستم کرد بە گریان، باوکم سەری بەرز کردەوەو وتی کوڕە ئازیزەکەم بۆچی دەگریت؟ وتم بابە گیان بۆ حاڵ و شوێنی تۆ، وتی مەگری، چونکە خوای تعالی هەرگیز سزای من نادات، من لە ئەهلی بەهەشتم. دواتر داوای جبەیەکی خوری کرد و وتی لەمەدا کفنم بکەن، چونکە بەم جبەوە بەشداری غەزای بەدرم کردووە، لەو کاتەوە ئەم جبەم هەڵگرتووەو شاردوومەتەوە بۆ ئەم ڕۆژەم. کاتێك سەعد وەفاتی کرد والی مەدینە مەروانی کوڕی حەکەم بوو، بۆیە مەڕوان نوێژی مردووی لەسەر کرد. سەعد دوای خۆی دووسەدو پەنجا هەزار درهەمی جێهێشت.

## کۆتایی

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەستەی هەڵبژێردراو بوون بۆ وەرگرتنی پەیامی الله تعالی و بەجێگەیاندنی لەبەردەستی سەروەرماندا و ئەزموونکردنی لە دوای وەفاتی خۆشەویستمان، لەوەشدا نموونەی باڵا بوون و توانییان الله لە خۆیان ڕازیی بکەن و دەقەکانی قورئان و فەرمووده ئەستۆپاکییان بسەلمێنن.

جێی سەرنج بوو بۆم کەسانێك کە توانیبێتیان الله تعالی لە خۆیان ڕازیی بکەن، بتوانن کۆتا پەیام لە کۆتا پێغەمبەرەوە ﷺ وەربگرن و بە ئەمانەتەوە بیگەیەنن بە مرۆڤایەتی و ئەمڕۆ ئێمە لەسەر بنەمای ئەو هەنگاوەی ئەوان سەرقاڵی دینداریی بین، دەکرێت چەند وانەیەکیان لێوە فێر ببین بۆ ژیانمان، بەڵکو ئێمەش بتوانین وەك ئەوان الله لە خۆمان ڕازیی بکەین و خزمەتێك بە نەوەی دوای خۆیشمان بکەین.

ئێمە بە دەقی قورئان ڕێنمایی کراوین پێشەنگیی بکەین بە پێغەمبەرانی خواوە ﷺ، وەك لە قورئاندا هاتووە (فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهِ)، هەروەها ڕێنمایی کراوین پێشەنگی بە کۆتا پێغەمبەرەوە بکەین ﷺ (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ)، هاوەڵان یەکەم نموونە بوون کە توانییان ئەم پێشەنگییانە جێبەجێ بکەن و خوای گەورەش شایەتییان بۆ بدات و لێیان ڕازیی بێت، واتە براوە بون، دەبێت ئێمەش پێشەنگیمان بە هاوەڵانەوە هەبێت و لە شێوازی ژیان و هەڵسوکەوتیان وردبیینەوە، بزانین چۆن توانییان پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ درێژە بە پەیامەکە بدەن و دینی الله تعالی بگەیەنن بە سەرجەمی مرۆڤایەتیی؟ ئاکار و ڕەفتاریان چۆن بوو؟

ئەگەر بتوانین لە ژیانی هاوەڵان و هۆکاری بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا لەلایەن ئەوانەوە بکۆڵینەوەو بگەینە ئەنجام، پاشان هەمان ڕێڕەو لە ژیانماندا بگرینەبەر، پشتیوان بە الله تعالی ئێمەش دەتوانین بگەین بە ڕەزامەندیی پەروەردگار.

فنسأل الله عز وجل أن يعجل فرج هذه الأمة اللهم أقم علم الجهاد واقمع أهل الزيغ والفساد وانشر رحمتك على العباد. يا من له الدنيا والآخرة وإليه المعاد وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.




پرۆژەیەکی تەواو سەربەخۆی ئیسلامیە لە پێناو بەرز ڕاگرتنی شەریعەت و بەرنامەی خوای گەورە دژی هەموو ڕێچکە خوار و فیکرە سەرلێشێواوەکان دەوەستێتەوە کتێبخانەی توێشوو بە بەڵگەی قورئان و سوننەت بانگەوازی خوای دەکات





بە هیوای سود بینین لە بڵاو کراوەکانمان

# سەرچاوە

- البداية و النهاية لابن كثير.

- الإصابة في تمييز الصحابة

- العواصم من القواصم.

- أسد الغابة، ج٣، ص ٦١٦.

- سير أعلام النبلاء للذهبي

- الطبقات الكبرى لابن سعد،

- الإستيعاب في معرفة الأصحاب،

- المعجم الكبير للطبراني،

- السيرة النبوية لابن هشام